# چرپەکانی تەمەن

دیزاینی بەرگ و ناوەوە ← شۆڕش غەفووری

شیعر ← ئاری رەفیق

تایپ ← هێدی

مۆتیڤ ← شۆڕش غەفووری

چرپەکانی تەمەن ...

ئەوچرپانەی کە نۆبـەرەی بەرهـەمی ئەدەبیمـە و کۆشـشی پێـنج سـاڵەی ڕۆچوونمە بەناو (خودبوون)ی تەمەنی خۆمدا.
لـە دیـدی منـدا .. (شـیعر) ئـەو دونیـا پـاك و پڕاوپـڕ لـە بەرائـەت و بـێ خەوشەیە کە هەرکەسێ نەتوانێ پڕ بەپێستی میهرەبانیەکەی دەسـت بـە باڵەکانیەوە بگرێ و لەگەڵ شـوێن پـێ نەرمەکانیـدا ڕێ بکـا ئەسـتەمە تـا سەربتوانێ لە باوەشی پڕمیهری شیعردا بمێنێتەوە.
زۆر بـوون ئەوانـەی بـە (شـیعر) دەسـتیان پـێ کـرد و دواجـار بـەکزی کوژانەوە و تەنانەت لە شیعریش یاخی بوون، ئەوە شـیعر نـەبوو دەسـتی لە یەخەی ئەوان گیرکردبـو بـەڵکو ئـەوە ئـەوان بـوون شـەڕیان بـە شـیعر دەفرۆشت و یەخەی شیعریان بەرنەدەدا!
ئاخر هونەری شیعر هونەری نوسینەوەی هەستە راستەقینەکان و لێزمەی بـارانی سـۆز و بـاڵگرتنی بـەزەیی و دەسـتکردنە گـەردنی بەرائـەت و باوەشـکردنەوەیە بەجەسـتەی میهرەبانیـدا .پـەیامی شـیعر پـەیامی (ڕاستگۆیی وخودبوون )ە.هەستی خود بوون ڕوخساری بێگەردی شـیعرە ، بەمانایەکی دیکە ئەگەر مرۆڤ بتوانێ لە فرەکایەکانی تریدا

هێزی خۆی لەسەر (دوالیزمی کەسایەتی) خۆی پەرەپێبدا ،ئـەوا هونـەری بـێ خەوشـی شـیعر کـەمترین دەرفـەتی (دوو جەمـسەری و نـاخودبوون) ناهێلێتەوە .

لەگۆشەنیگای خۆمەوە ئەگەر شـیعر نـەیتوانی موچـڕکەیەك بەجەسـتەدا بـێنێ و تەزوویـەك بـەگیان نەبەخـشێ و ڕامانـەچـڵکێنێ و لـە شـوێنی خۆیەوە مانا ڕاستەقینەکەی خۆی لەدایك نەبێ جگە لـە چـەند وشـەیەکی سارد و سڕ و بێ هەناسە و بێ گیان پەیامێکی نیە .

ماوەتەوە بڵێم ...

ئەگـەر کاریگـەری هەنـدێ دۆسـت و هـاوڕێ و ئـەو کەسـانە نەبوایـە کـە ڕاستگۆیانە لەزمانی شیعری حـاڵی بـوون لای خۆمـەوە پـێم وابـوو جـارێ زووە بۆ لەدایك بوونی ئەم کۆمەڵە شیعریەم .

هەست دەکەم هەموومان (ونبوین) لەناو شتە ئاڵۆزەکانداو تامەزرۆی خـۆ دۆزینەوەین لـەناو شـتە سـادەکاندا . هـەر بۆیـەلای خۆمـەوە هەوڵمـداوە سادەییەك ببەخشم بە شـیعرە کـانم. ئەگـەر ناویـشتان لـێ نـەنا (شـیعر) گرنگ ئەوەیە مرۆڤ بۆ (خود بوون) ی خۆی بگەڕێتەوە .

*ئاری رەفیق*

*٢٠٠٦/١٠/١٤*

هەرگیز

لەتۆ تورە نابم

گەر تورەش بووم .. وەك شنەی بام

زۆرم پێناچێ

دێمەوە ،

ئەی ئەستێرە

لە رووخساری شەوی مندا

قەت ون نابی .. گەر ونیش بویت

وەك خۆم

نزیکیت

لێمەوە .

پاییزی ( ٢٠٠٥ )

چەندخۆشە

گەر دەڵێی ( شێتە )

گەر شێتیش بم

لەو ڕۆژەوەی تۆم بینیوە ،

سور دەزانم

هۆشیشم هاتۆتە نیوە .

لەوەتەی هەم ..

پەڕ و باڵی ئاسودەییان

زۆر دەمێکە

هەڵپاچیوم ،

زۆر دەمێکە

چریکەی پێکەنینیان

بڕیوم .

زانكۆشم

بە تۆوە خۆشدەویٚ ،

ئەو ئێوارەیەی ناتبینم

دڵم

یەك چركەش ناسرەویٚ .

هەموو دەمەو ئێوارانێک

بەرلەوەی بڵێی

( ئێوارەت باش .. چۆنی شێته! )

لەدوورەوە

گوێم لە چرپەی دەنگی پێته .

چەندخۆشە

گەر دەڵێی ( شێتە )

بەدەست خۆم نییە

وەکو پشکۆ

گەش دەبمەوە ،

بروسکەیەك دێ بە دڵمدا و

دەمرم و

زیندوو دەبمەوە .

زستانی ( ٢٠٠٦ )




پێمخۆشه..منداڵ ببمەوه

(1)

گەر لێم گەڕێن

لەگەڵ تۆدا

پێم خۆشە منداڵ ببمەوە..

منداڵ ببمەوە

وەک جاران،

شەرم نەکەی

تۆش بە ماچان..

ڕوومەتم تەڕ کەی.

وەک باران .

(٢)

گەر لێم گەڕێن

بە بەرچاوی هەموو دونیا

هەر بەنوێژی نیوەڕۆیە

لەسەر ..

پشتی ڕانەکانت

ئۆقرە دەگرم و

دەخەوم ،

خۆم دەزانم

دەچمەوە عومری منداڵیم

خۆ گەر..

گیانیشم دەرنەچێ

ئارام دەگرم و

دەسرەوم .

(٣)

وەرە شۆخێ

دەستەکانت

وەك

دەسرازە ..

لەهەموو گیانمدا .. بپێچە

بەئەسپایی ..

لە بێشکەی باڵاتدا

ڕامژێنە ،

خودایە

ئەوکات ..

پێمخۆشە بمرم

ڕۆحم

لە جەستەم

بستێنە...!

زستانی ( ٢٠٠٥ )

**وانەزانی**

**دڵم**

**هێندە ساردوسڕە ،**

**کڵۆیەک بەفرە و**

**بێ تروسکایی و**

**بڵێسە و**

**گڕە .**

خەیاڵ نەکەی

ئەو پەنجانەم

بۆ

گوشینی پەنجەکانت

وەکو گەڵای پاییزی زەرد

بێ هەناسەن ،

واشتێنەگەی

ئەو لێوانەم

بێ ئارەزوون و بێ تاسەن .

چەند ..

ئامەزرۆی شەویکی نوێم

چەند ..

ئامەزرۆی ژوورێکم بێم

بەبێ ترس

سەرم

لەسەر سینگت ڕاخەم ،

دەرگاش لەسەر

هەرچی

یاسا و نەریت هەیە

توند توند داخەم .

بەچاوی تۆ

دڵم نایە

وەک خۆم پەیوەست بی

پێمەوە ،

نەوەک ڕۆژێ

مەرگ

هەناسەم بستێنێ و

سەری ئەبەدیم

بنێمەوە .

زستانی ( ٢٠٠٥ )

چەند

بە تاسەی ئەو شەڕانەم

کە ..

دەیان جار

شوشەی ئەو دڵەی لێ شکاندووم ،

چەقۆی خەفەت

پەردەی هێمنی پێ دڕاندووم .

هەرکە دەیگوت

( هێمن بەرەوە .. شێتە گیان )

نازانم چۆن ؟!

باڵام

وەک فەرشەکەی جاران

لەژێر پێیەکانیدا

ڕاخرا بوو ،

تەنیا لە چاوترووکانێکدا

هیچ شتێ لە دڵمدا

نەمابوو ..!!

زستانی ( ٢٠٠٦ )


ئیستالەکوێی..؟
ئەی...
نیشتمانی دلەکەم،
تروسکەی چاوەسوورەکانم
هەناسە
شێتەدوورەکەم،
سەدئەوەندەش
لەمندووربی...
هێندەم
دەستی تۆگوشیوە
بۆنی ئارەقەی یەك
بەیەکی
نێوان...
پەنجەنەرمەکانت
لەدەستمدا
وەك
خۆی ماوە،

**سەفەرنامە**

ئێستا لە کوێی ..؟

ئەی ..

نیشتیمانی دڵەکەم ،

تروسکەی چاوە سوورەکانم

هەناسە

شێتە دوورەکەم .

سەد ئەوەندەش

لە من دووربی ..

هێندەم دەستی تۆ گوشیوە

بۆنی ئارەقەی یەک بەیەکی

نێوان ..پەنجە نەرمەکانت

لە دەستمدا

وەک خۆی ماوە ،

***هەتا ئەمڕۆش ..***

***تامی***

***ئەو لێوە تەڕانەت***

***بەسەر***

***لێومەوە جێماوە .***

ئێستا لە کوێی ..؟
ئەی ..
نیشتیمانی دڵەکەم
دە وەرەوە ..
تا نەمردووم
شوشەی دڵە شکاوەکەم
بە پەنجەی خۆت
کۆکەرەوە ،
دە وەرەوە ..
تا نەمردووم
باڵەکانی میهرەبانیت
بە یەکجاری
بکەرەوە .

بەهاری ( ٢٠٠٦




**خودایە ترسم نەشکێنی**

( 1 )

دڵم نایە

زۆر سەیرت کەم ،

دەترسم . . .

ترسم لێت بشکێ

باڵاپۆشی هەموو جەستەم .

( ٢ )

که دەتبینم

وا دەزانم

هەموو دونیا

بۆ من

لەسەر پێ وەستاوە ،

وا دەزانم

فریشتەیە و

خودا

بۆ منی هێناوە .

( ٣ )

که دەتبینم ...

وەک ئاوێنە سەیرم مەکە

نەوەک

پێڵووی چاوەکانم

تا کۆتایی ژوان

داخەم ،

تەزووی شەرمنیم مەشکێنە

نەبا ..

پێخەفی ئارەزووم

لە سەرتاپای باڵات

ڕاخەم .

( ٤ )

زۆر دەترسم

لەژوانێکدا ..

پەنجەم لە پەنجەت بئاڵێ و

لێوەکانم

سەر بنێت

بە سینگی لێوتەوە ،

نەکەی

ئەوکاتە گلەیی بکەی

نەک تەنها تۆ

خۆشم لەبیر بچێتەوە ،

( ٥ )

خودایە تۆ

بەو دڵەم بڵێ ...

با بەس سەرەتاتکێ بکا

یان ..

با بمرێ ،

یان ..

لە دڵی ئەو شۆخەدا

بە یەکجاری

ئۆقرە بگرێ .

زستانی ( ٢٠٠٥ )


گلەیی
وەك باران
نامشۆیتەوە
لەئاسمانی
ڕووخسارتەوە
بەبیردەکرد
وەکو جاران
ئەو وێنەی
ماوەیەکە
چاوەکانت
پێناکەنن

**گلەیی**

ماوەیەکە

چاوەکانت پێناکەنن

وەکو جاران ،

ئەو ئەوینەی

لە ئاسمانی ڕوخسارتەوە بەدیم دەکرد

نامشواتەوە

وەکو باران .

شەرمم لێ مەکەو

هاتووم

گلەییەکانتم

بۆ هەڵڕێژە ،

ئەو سینگەم

خاکی ژێرپێتە

بەس ئەم جارە ئاشت بەرەوە و

ڕقی ئەو دڵەت

بنێژە .

زستانی ( ٢٠٠٦ )

**کە جەستەی خۆر**

**لای ئێواران**

**سەفەر دەکا ،**

**کە سێبەرم بە ئەسپایی**

**لاشەی ساردم**

**بەڕێ دەخا .**

***وادەزانم ..***

***فریشتەی خوا***

***باڵی تۆڵەم لێ دەخشێنێ !***

***کە شەویش هات***

***هەزاران جار***

***گیان و دڵم لێ دەستێنێ .***

نازانم بۆ هەڵناوەرێ ؟

درەختی ئەم

دەردەسەریەم ،

سەد ئەوەندەش

پیری کردووم

ئەم

زەردە پاییزی بێ تۆییەم .!

هاوینی ( ٢٠٠٦ )




**چرپەکانی تەمەن**

بمشارەوە ..

لە سوچێکی ئەو دڵەتدا

تاکو چیتر

بەترسەوە سەیرت نەکەم ،

بمشارەوە ..

لە سنووری

گلێنە شابازیەکانتدا

تا لێرەوە .. بەڵێن بدەم

لە پەنجەرەی چاوەڕوانی

دڵی

شۆخێکی تر نەدەم .

***ببە سنوور ..***

***لەسەر***

***نەخشەی خۆشەویستیم ،***

***تا نەمێنێ و***

***ڕەشبێتەوە***

***هەوری خەستی خەم و پەستیم .***

بمشارەوە ..

لە سوچێكی ئەو دڵەتدا

دەبا چیتر ..

بە چرپە و

ترس و

شەرمەوە

ا بەیانی باش ات لێ نەكەم ،

دەبا چیتر ..

سیمای غەریبی و

تەنیاییم

بۆ بەرد و داریش دەرنەخەم .

٧ -٧-٢٠٠٣

ئەی خودا

تۆ ...

ئەو گیانەی منت

بۆ نەکێشا ..؟!

کاتێ

گڕووی گەرمی دەستم ..

بە شەرمەوە ،

لە سینگیدا

ژێر کردەوە .!

ئەوگیانەی منت

بۆ نەکێشا ..؟!

کاتێ

لە ناو ..

دڵی ژوورێکی بێ دەنگدا

ماچم نەخشاند

هەناسەی سینگیم

هەڵکێشا .

ئەی خودا

تۆ ..

ئەو گیانەی منت

بۆ نەکێشا ..؟!

هاوینی ( ٢٠٠٢ )




**پەیوەست بوون**

ئەو رۆژانەی

کە ناتبینم

هەرکەسێ بمخوێنێتەوە

دەزانێ

چەندە پەیوەستم،

بێ ئەوەی

تێبگا بۆ کێیە؟

حەزو ئارەزوو و مەبەستم.

هەرکەسێ بمخوێنێتەوە

بێ ئەوەی بپرسێ

تێدەگا

بەشێکی جەستەم

لێ ونە!

تا ..

روخساری تۆ هەڵنەیە

هەر چرکەیەکم

مردنە .

٢٠٠٦/٩/٢٩

هەموو گەردی بەیانیەک

من ئەو دڵەم

کە ژان دەیگرێ .. خۆ ناسرەوێ ،

بێ قەزابێ

تا هەڵنەیەت ڕوخساری تۆ

لە سینگمدا

دێت و دەچێ .. داناکەوێ .

که دەتبینم

گوێم لە دەنگی

دڵی خۆمە ،

سینگم شەق کەی

جا تێدەگەی

چەند تامەزرۆی

چرپەی

لێوەکانی تۆمە .

پڕاوپڕی گلێنەکانت

سەیرم مەکە

نەبا جەستەم ..

وەکو بەفری بەر خۆرەتاو

بە نیگایەك

ڕەشبێتەوە ،

بەدەستم بێ

هەموو گەردی بەیانییەك

سینگم دەکەم

بەشوێنی پێت

تا ..

هەناسەی گەرمی گەنجیم

کۆتایی دێ و

دەبڕێتەوە .

پاییزی ( ٢٠٠٣ )


بمناسەوە
بمناسەوە
ئەم جاریان.. من
کازیوەم
گەرهاتمەوە
لەکازیوەش
هێشتنترم
نارۆمەوە،
گەرهاتمەوە
چیتر
جەستەت
بەبارانی
خەستی
خەفەت
ناشۆمەوە.

**بمناسەوە**

**بمناسەوە**

**ئەمجارەیان .. من کازیوەم**

**گەر هاتمەوە**

**لە کازیوەش هێمنترم**

**نارۆمەوە ،**

**گەر هاتمەوە**

**چیتر**

**جەستەت**

**بە بارانی خەستی خەفەت**

**ناشۆمەوە .**

وەك ...

ڕۆژی ڕوون لەبەر چاومە

ئەم غەریبیە

پیرم دەكا ،

وا تێنەگەی كە ونبووی لێم

نیگا و

خەندە و

خەرامانی شۆخێكی تر

جارێكی تر

مەستم دەكا .

ئەمجارەیان

گەر هاتمەوە .. چاوەڕێم بە ،

نارۆمەوە ..

لە پێشوازیی سەرسنووری سەرەڕێم بە .

پاییزی ( ٢٠٠١ )

(1)

ئەمڕۆ هاتووم

بەڵێن بدەم .. چیتر شیعر

بۆ تەنیاییم نانووسمەوە ،

لە پێخەفی نیوەشەوی بێداریمدا

گەر تۆ نەبی .. فرمێسکی خەم

بۆ هیچ کەسێ ناسڕمەوە .

(٢)

ئەمرۆ هاتووم

شورەی ( ترس )و

تەوقی ( شەرم )

لەبەردەمتا تێک بشکێنم ،

هەرچی ڕازی ..

ئەمڕۆی گەنجی و منداڵیمە

لەم ساتەوە

بۆ ئەبەدی پێت بسپێرم .

(٣)

کە تۆش هاتی ..

پرس مەکە و

بەبێ هێڵی سنووری سوور

وەرە ناو خاکی

دڵمەوە ،

تا دەتوانی ..

لەناو گلێنەی چاوەکانت

هەڵم بگرە و

بمبە

بەهەشتی

ژینمەوە .

هاوینی ( ٢٠٠٢ )

کە ناوی تۆم

دێتە بەرگوێ

ئەی ئاونگی

سەر ڕوومەتەکانی گەڵا ،

خۆڕاگریم بیردێتەوە

هێندەی سەختیی سینگی چیا و

بەرزیی قەڵا .

**کە ناوی تۆم**

**دێتە بەرگوێ**

**ئەی بارانی وشکە ساڵیم ،**

**واهەست دەکەم**

**نمەی سۆزێ دەیشواتەوە**

**پەڕەی دوێنێی**

**ژینی تاڵیم .**

بۆ پاییزی تەمەنی من

لە دڵمدا

هەمیشە سەوز دەنوێنی ،

خوا نەکا .. گەر

تۆش هەڵوەری

خۆم دەزانم

پشتی ئومێدم دەشکێنی .

پاییزی (٢٠٠٤ )


برژانگ
ئەوبرژانگە
قەترانیانەی
هەموو
شەوێ
لەسەر
ڕۆخی
پێلوەکانت
پاڵ
دەکەوێ

برژانگ

ئەو برژانگە قەترانیانەی

هەموو شەوێ

لەسەر رۆخی پێڵوەکانت

پاڵدەکەوێ

چۆن تا ئێستا .. بە بروسکەی

ئەو ..

نیگا شێتە گەرمانەت

تاڵ بەتاڵی

نەسوتاون ؟

چۆن تا ئێستا

وەکو خاکی ئەو دڵەی من

نەبرژاون ؟!

سەیرە گوڵم !

عەیامێکە

ناودڵی من .. هەڵقرچاوە ،

خۆشم نازانم

هەناسەم

چۆن تا ئێستا زیندوو ماوە ؟!

پاییزی ( ٢٠٠٤ )


ئەورۆژانەت
بیرچۆتەوە ؟ !
ترسم
لەگەڵ
خزان
وجولەی
ئەستێرەشدا
دروستکرد بوو
وام
دەزانی
دوا نامە

**دوا نامە**

دڵم بێنه

ئەم جارەیان نایدەم بە تۆ ،

نەوەک جارێ

هەزاران جار   ببیە خۆڵەمێش و پشکۆ

دڵم بێنه

ئەم جارەیان نایدەم بە تۆ ،

نەوەک جارێ

هەزاران جار

ببیتەوە بە هەناسەم ،

بمکەی بە( تاج )

بۆ

سەر سەرت

ببی بە سێبەر و

تاسەم .

ئەو رۆژانەت بیر چۆتەوە ؟!

ترسم لەگەڵ

خزان و جوڵەی ئەستێرەشدا

دروست کردبوو

وامدەزانی ،

کە شەو دادێ

بۆ تۆ دەبێ

بە قوربانی .؟

ڕقم لەگەڵ مانگەشەودا داگرتبوو

وامدەزانی سەرشێتێکە

تریفەی باڵ

تەنها بۆ تۆ

واڵا دەکا ،

سات تا ساتی دەرکەوتن و ئاوابوونی

لەبەر پێتە و

بۆ دیدەنیت

سکاڵا دەکا .

نەکەی

دەواری ئەم حەزەت ،

لەسەر خاکی ئەودڵەی من

جارێکی تر

هەڵدەیتەوە ،

تیشکی خۆریش لەچاوتا بێ

نە ناسیومی

نە دەتناسم

نەیەیتەوە .

هاوینی ( ٢٠٠٤ )


وتم
ناسك
لەوەتەی
هەم.. بەچاوی
تۆ
لەژوانی
کەسیتردا
نەگریاوم
لێو

**لێو**

وتم ناسك

لەوەتەی هەم .. بەچاوی تۆ

لە ژوانی کەسی تردا

نەگریاوم ،

نە بۆ ..

لەنجەو لار و نازو

نە بۆ ..

بالأ و

نیگای چاوی هەرچی شۆخە

نەسوتاوم .

گەر دەتەوێ .. لێرە بەدوا
وەك
ساوایەك
گڕووی جارناجارم ژیرکەی
بەڵێن بدە ..
هەموو ژوانێك
لێوەکانم لە ماچاندا
مەست و
تەڕ و
سوور و
سڕ کەی .

پاییزی ( ٢٠٠٣ )


دواهەناسە
دیسانشەوە،
هەنسکەکانیبێتۆییم
دەستلەملانێیبێشکەیخەوە
دیسان..
شەوەزەنگیمنەو
چیتر..
بەرگەیچاوەڕوانیتناگرم.. گوڵێ،
لێوەکانیپێنووسەکەم
وشکهەلات
هێندەی
بەڕوویقەشەنگیتدا
شیعر
بۆبێدەنگیتبلێ.

**دوا هەناسە**

دیسان شەوە ،

هەنسکەکانی بێ تۆییم

دەست لەملانێی بێشکەی خەوە .

***دیسان ..***

***شەوەزەنگی منە و***

***چیتر ..***

***بەرگەی چاوەڕوانیت ناگرم .. گوڵێ ،***

***لێوەکانی پێنووسەکەم***

***وشک هەڵات***

***هێندەی***

***بە ڕووی قەشەنگیتدا***

***شیعر***

***بۆ بێدەنگیت بڵێ .***

***هەموو شەوێ***

***لە ئەلبومی وێنەکانما***

***تا چاو بڕ کا***

***لە ڕووی جوانیت دادەمێنم***

***لەناو ڕۆحی بێ دەنگیمدا***

***زۆر بە وردی ڕادەمێنم***

نازانم بۆ ؟!

نە چاوی کەس

وەک چاوی تۆ

هێندە سەوداسەری کردووم ،

نە باڵی کەس

وەک باڵی تۆ

بۆ بەهەشتی

ئەوینێکی

بەرزی بردووم .!!

پاییزی ( ٢٠٠٢ )

***لەو ڕۆژەوەی***

***کە تۆ هاتی ..***

***اکاکات لکاند .. بە ناومەوە ،***

***تۆ هەر ..***

***بە خۆشت نەزانی***

***خۆت و***

***دڵ و***

***چاوەکانت***

***هاتیتە ناو چاوانمەوە .***

خۆدەزانم

تا تۆ ماوی

نە ناوم

بە ڕووتی دەهێنی ،

نە ڕەگی

ئەو دڵ و چاوەشت

لە چاوی مندا دەڕوێنی .

نه دەتوانم

پڕ بە پێستی ئارەزووی خۆم

خۆمت

بکەم بە قوربانت ،

نه بۆم دەلوێ

بۆ گرتنی ئەو سێوانەت

دەستم

بکەم بە ستیانت .

ئەو

برینە پڕ لە سۆیەم

لایەکی دڵمی گرتووە ،

هاکا .. ڕۆژێ

بەو داخەوە

ئەو دڵەی من

بۆ تاهەتایە مردووە .

٢٥ / ٧ / ٢٠٠٦ ز

(1)

لەوەتەی تۆ

دەستت ناوە بە ڕومەوە ،

نە هێمنی بانگم دەکاو

نە پێکەنین

پێدەنێتە گەروومەوە .

( ٢ )

پێم نەوتی

سەفەر مەکە

کۆرپەی شیعرم

هەموو هەموو درەنگانی شەو ،

بۆم ژێر نابێ

گرووو دەگرێ لە ژوانی خەو ؟!

( ٣ )

.. مالْت ئاوا

بەلاّم توخوا بیرت نەچێ

لە غوربەتی

ئەو دەڤەرە خەفەتبارە ،

کەی هاتیەوە

پاسەوانی سەرە ڕێتە

کوڕە شاعیرێکی تینوو

بۆ ئەم شارە .

زستانی ( ٢٠٠٦ )

(1)

وتت دەڕۆم

بەرلەوەی بڕۆی

ئەگەر ویستت

تەنیا جارێ گوێم بۆ شل کە ،

تا ..

دەتوانی

تێرتێر

پەنجەکانم بگوشەو

گلێنەکانت

لە ڕوخساری مندا سڕ کە .

(٢)

وتت دەڕۆم

ئەگەر ڕۆیشتی

گریمان

باڵی هەوەسبازێک

ویستی باوەش ..

بۆ بەهەشتی سیمای ناسکیت

بکاتەوە ،

نەکەی گوڵێ

لە باوەشیا خۆت ون نەکەی

نەبادا خەو

تا سەحەرێک

سەرمەستت کاو

بتباتەوە .

(٣)

ئەگەر ویستی

پەنجەکانی تەنیا جارێ

لە زوڵف و گەردنت

گیر کا ،

دوورکەوە لێی

ئەوە من نیم

نەوەك

تاسەی لێوە کانت

لە ڕێژنەی ماچاندا

سوور کا .

(٤)

هەموو ڕۆژێ

وەك پرچی خۆر

لە کازیوەی بیرەوەریی منا هەڵدێی

دەتناسمەوە

لە هەرجێ بی ،

چەندە دوور بی

بازووی بیرمی

گڕ و

تینوو

هێزی ژینمی

لێم ون نابی

لە هەر کوێ بی ..!

پاییزی ( ٤-٢ )




**سەفەرێک لەوڵاتی دڵمەوە**

لەو ڕۆژەوەی کە لێرە نی

سۆمای چاوم

لەجاران زیاتر

کز بووە ،

بەرلەوەی خۆم بخوێنمەوە

سور دەزانم

تاڵێکی تر

دیسان لەو قژەم

سپی بووە .

پێم نەوتی
سەفەرمەکە
هێشتا
لەچاوم ون نابی
گوریسی ئومێدم
دەپسێنی ،
هێندە هەست دەکەم کە تەنیام
وەختە
ناودڵم دەربێنی ..؟

زستانی ( ٢٠٠٦ )

کەس نەزانێ .. من دەزانم

زامی ئەنفال

چەندە پڕ ئێش و بەسۆیە ،

لەسەر سینگی دڵی دایکێک

هەرلە ئێستا

ئێستاش نەبێ .. کەمێکی تر

بۆ پێشوازی

گوێ هەڵخستووی دەنگی پێیە .

خۆ من ...

گرمەی ئەو هەورانەی

لە ئاسمانی باشورەوە دەناسمەوە

کە جارجارە

بە لێزمە بارانێکی قەترانییەوە

سەریان دەداین

وا پێدەچوو

هەواڵێکی ڕەشیان پێ بێ

بەڵام ..

لەکوێ بیان دۆزمەوە

خوایە لەکوێ ؟

خۆ من ...

جریوەی شەڕەکانی

ئەو چۆلەکە پاساریانەی

ناو

حەوشەکەی ماڵەکەمان

دەناسمەوە ..

کە جارجارە سەریان دەدایین

وا پێدەچوو ..

سۆراغیکی ئاسکەکانی گەرمیانیان

هەڵگرتبێ

بەڵام ..

لەکوێ بیانناسمەوە

خوایە لەکوێ ؟

خۆ من ...

سیمای ئەو ئەستێرە سەفەریانەم

لەبیر ماوە

کە جارجارە ...

نەک جارجارە .. هەموو شەوێ

بە ئاسمانی کوردستانەوە دەکشان

هەر ئەو کاتەش

وا پێدەچوو

شوێن پێی ...

بارزانیە بەرزەفڕەکانی

دڵی مێژووی کورستانیان

هەڵگرتبێ

بەڵام ..

لەکوێ بیاندۆزمەوە

خوایە لەکوێ ؟

**لەکوێیان بۆ بگەڕێین**

**لەکوێ ؟**

**لە سێبەری**

**کام چنار و گوڵ و دارێ ؟**

**لە کەناری**

**ڕێگە و شەقامی کام شارێ ؟**

**لە سوچێکی**

**کامە باخ و ؟**

**لەبن بەردی**

**سەخت و دژواری کام شاخ و ؟**

**لەژێر پەتی**

**کام قەنار و ؟**

**لەناو گەرووی**

**وشک و تینووی**

**کام ڕووبار و ؟**

**لەکام لادێی**

**وێرانکراوی چۆڵ و هۆڵدا ؟**

**لەکام لوتکە و**

**لەکوێی دەشت و گرد و دۆڵدا ؟**

***ئێستا ئێوه...***

***ئەی ئەوانەی***

***چاوەڕوانی پیری کردوون ،***

***ئەی ئەوانەی***

***هەوری ڕەشی نەهامەتی***

***هێندەی دەریا***

***فرمێسکی خەستی پێ ڕشتوون .***

کەس نەزانێ .. من دەزانم

لە سەردەمی

شکانی شوورەی ژێردەستیدا

لە زەمەنی

گەورەبوونی کۆتری باڵای ئاشتیشدا

خۆتان نەبن

کەس لە زمانی ئێوە ناگا ،

بۆ گەرووی وشک و تینوتان

جامێ ئاوتان

بۆ پڕ ناکا .

ئەی ئەوانەی

دەیان ساڵە

ئیشکی چاوەڕوانیتان گرتووە ،

ئەی ئەوانەی

لەوەتەی هەن

پۆستاڵ ڕەشە کوردکوژەکان

لەسەر خاکی

خەزان ئاسای دڵی ئێوە

پێخەفی مەرگیان خستووە .

چ ژینێکە ...

لەسەر

سفرەی نانخواردن و

لەسەر

پێخەفی نوستن و

لە گوێگرتنی گۆرانی

لە خوێندنەوەی شیعرەکانی

شێرکۆ و

پەشێو و خانی

تەنیا

هەرخۆت

خۆت و

خۆت بی ،

چەندە سەختە

هەتا مردن

هەر چاوەڕێ و

هەر بێکەس و

هەر سەوداسەر و

کڵۆڵ بی .

زستانی ( ٢٠٠٤ )

هێشتا دەمەو بەیانی بوو ...

یەکەم ڕۆژی

جەژنی شوبات

چرچ و لۆچی

ناوچاوانی قەڵام بینی

زۆر بەسام بوو ،

لەم لاشەوە ...

لە ڕوخساری پیرە منارەکەی چۆلی

ورد بوومەوە

زۆر سەرسام بوو .

هەر ئەو ڕۆژە

هێشتا دەمەو بەیانی بوو ...

لایەکم

لە شەقامەکەی بەردەمی مزگەوتی سپیدا

کردەوە

کە سەیرم کرد

پیاوێکی بەرزی مەیلەو پیر

لەبەردەمی مزگەوتەکەدا

وەستاوە ،

***یەکسەر زانیم ..***

***هاتۆتەوە پێمان بڵێ***

***لەکوێ هاتوون***

***هەر بۆ ئەوێ بڕۆنەوە ،***

***بەربەریەکان***

***لافاوێک خوێنیان هێناوە .***

یەکسەر زانیم ..

هاتۆتەوە پێمان بڵێ

دەستم دامێنی باڵاتان ...

زەردەخەنە و

نوقڵ و

تەوقە و

ماچەکانتان

هەتا زووە بپێچنەوە ،

ئەوان فێرن

هەناسەتان

هەرلە ئێستا و لەو شوێنەدا

بەبێ کفن

بنێژنەوە .

لەوەتەی هەین ..

لەگەڵ ریشەو

رەگی ا زام ادا

موتوربە بووین ،

لەوەتەی هەین

هەرهەموومان .. لەگەڵ ا سام ادا

گەورە بووین .

پەنجەکانمان ...

لە مەچەکی باڵی خوێندا

هەڵکێشراوە ،

ناوی ئافات ..

لەسەر تەختی ناوچاوانی هەریەکێکمان

لە ئەزەلەوە

کوتراوە .

لەوەتەی هەین ..

لێناگەڕێن

ماچ .. لە زەردەخەنە

بستێنین ،

لێناگەڕێن

دەم و لێومان

لە ئاسودەیی بخشێنین ..

نازانین بۆ کامتان بگرین ،

فرمێسک بۆکامتان بسڕین .

٢ –شوبات –٢٠٠٤


لە
ی
24
دا
دیسانەوە
چەمێکیتر..
لەبارانی
زامی
سەختی
بێهەتوانی
وڵاتەکەم
لە(قەڵادزە)ی
دەستەخوشکی
(هەڵەبجە)وە
جۆگەدەگرێ؛

**لە ۲٤ / ٤ دا**

دیسانەوە چەمێكی تر ..

لەبارانی زامی سەختی بێ هەتوانی

وڵاتەكەم

لە ا قەڵادزە ای

دەستەخوشكی

ا هەڵەبجە اوە

جۆگە دەگرێ ،

بست بە بستی

مەرگستانی بێ سەرحەدم

دەشواتەوەو .. گەرووی برسی

وەكو تێشوو

بۆ

نەوەی زانکۆی نۆبەرە و

پۆلێک

ڕۆحی پەپولەی شار

لەخۆی دەگرێ .

دیسانەوە ...

شاڵی سەوزی ( شێخ مەحمود )ی دەڤەرەکەم

ڕەنگی ژەنگی

ئاوزینگێکی حەژمەتاوی

دەداتەوە ،

شنەی گەرمی ئەم ئافاتە

زەنگی بروسکەی تراژیدیایەک

بە چرپەوە ..

بۆ گڵکۆکەی ( شێخ ریشوانم )

دەباتەوە ..

سەحەرێک بوو

قوڵپەی

هەنسک و

گرینێک

لە مەندیلی تورە و پەستی قەندیلەوە

جاڕی دەدا ،

کێ لەم گەرمە شیوەنەدا

زادەی ڕەحمی ئەم دەڤەرە

ناسنامەی بێ

چارەنووسی بە هێڵی سوور

نەکێشراوە ..؟

تێر بەباڵای شۆڕەبیێ

کۆرپەی حەزی .. بە مووتوی خەم

نەپێچراوە ..؟

جارِ دەدا

هۆ خەڵکینە ...

نوکێک لەخامەی دێوەزمەی پاشای وڵات

تاجێکی ڕەش

بەسەر سەری قەڵاکەتدا دەنەخشێنێ ،

تابلۆی مەرگی

(١٣٨ ) کەللەی سرِی بەخوێن سوور و

مەدالیایەک

بۆ گەردنی بێ باوانی شارەکەتدا

وەک سومبولێک

دەنەخشێنێ .

غەیبیەکیش

لەدامێنێ ئاسۆسەوە

زایەڵەی دا ...

ئەمەش دڵۆپێ

لە فرمێسکی ساوایەکی کوردستانتە و

کەمێکی تر

ئاودامانی

پەڕێک لە مێژووی پڕ سەروەریت
دەشواتەوە ...
هەموو یادێک
لەم فرسەتە نەگریسەدا
موریدانی دیوەخانت
لەم کیشوەری غوربەتەوە
ئاهی ڕۆحی بەرزەفڕتان
بەو بەرزیەوە..
بە هەنسکی حەسرەتەوە
دەخواتەوە .

پێ ناکەنم ..

تا ئەو کاتەی

لێوی دایکی شەهیدانی

هەر ( چوار ) سوچی کوردستانم

نەڵێ ئۆخەی ،

تا ئەو کاتەی

سەدای گەرووی

هەق و

ویژدان

هاوار نەکا و نەچریکێنێ

نەڵێ تاکەی ..؟؟!!

٢٣ /٤/ ٢٠٠٠




**بۆ هەڵەبجەییەکان**

سڵاو .. هەڵەبجەییەکان سڵاو

منداڵە ڕووتوڕەجاڵەکانی شار و

کوڕە بەشمەینەتەکانی هەڵەبجە .. سڵاو

سڵاو هەڵەبجە

پایتەختی وڵاتی

خوێن و

خەفەت ،

کیشوەری دایکانی پیر و شەکەت .

هەر لێرەوە ...

دەست لەسەر سینگ

لە ( هەولێری )

جەستەی سووری شەهیدکراو ،

نەوەک جارێ

پێنج هەزارجار بۆتۆ سڵاو .

چەندین ساڵە ...

دەستتان

لەژێر چەناگەتان توندکردووە و

ژێر نابنەوە ،

بەڵام ...

تاجی بەرزی سەری مێژووشمانن

دڵنیابن

بیر ناچنەوە .

چەندین ساڵە ...

لافیتەی ڕەش

بەگەردنی ( شنرویٚ ) وە

هەڵدەواسریٚ ،

چەندین ساڵە ...

هەڵەبجەکەم

ناوت بە بەرزی

دەنوسریٚ .

لەناو
کۆپلەی هەر شیعرێکمان ،
لەسەر سینگی
هەردیوار و
هەرشەقام و
هەر یادێکمان .

ئەوەتانێ ...
ئەوبەیانیەی لە شانزەی سێ
بۆ یادی ئێوە دەوەستین
کە ڕوخساری
خاك و
خۆڵ و
دار و
بەردی
ئەم وڵاتەی خۆم دەبینم
سور دەزانم ..

وەکو ئێمەن

دڵیان

خەریکە بتەقێ ،

سور دەزانم ..

ئاسمان لەگەڵمان وەستاوە

وەکو دەریا ..

زۆری نەماوە بشڵەقێ .

ئەگەر ...

رێژنەی بارانێکی بەخوڕ هات و

جارناجارێ .. تەڕی کردن

دڵنیا بن ..

ئەوە لێزمەی چاوەکانی

یەک بەیەکی شەقامەکانی پیرە ( هەولێرە )و

هەور

بۆ ئێوەی هێناوە ،

ئەگەر

گوێشتان

بە هەنسکی گریانێکی

بێ ناونیشان زرینگایەوە

ئەوە دەنگی گەرووی منداڵێکی کوردە و

هێشتا نەبووە

بۆ مەرگی هەڵەبجە

گریاوە ،

بیناسنەوە

بەرلەوەی

بێتە

دنیاوە .

زستانی (٢٠٠٣)

